# نوێژ لە دوای کێ بکەم

## لەسەردەمی پڕ گوومڕایی و فیتنە و ئاشووب


شەرحکردنی :

اسماعیل سەیدی سوور

نووسینەوەی :

أحمد

# نوێژ لەدوای کێ بکەم ؟

لەسەردەمی پڕ گوومڕایی و فیتنە و ئاشووب

شەرحکردنی :

م. إسماعیل سووسەیي(خودای گەورە ئازادی بکات)

نووسینەوەی :

احـــــمـد

١٤٤٥هـ

# پێشەکی

الحَمدُ لِلهِ رَبِ اْلْعَالَمِينْ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلىٰ الْمَبْعُوثِ رَحْمَةً لِلْعَالَمِينْ، وَعَلىٰ آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمعين ، اللَهُمَ الطَّهِر قُلُبَنَا مِنَ الشُّبُهَاتِ وَالشَّهَوَاتْ وَأَعْمَالَنَا مِنَ الرِّيَاءْ يَارَبَ الْعَالَمِين امَا بَعدْ.........

ئێمە لەسەردەمێکی وا دەژین گوومڕایی و فتنە و ئاشووب یەک جار زۆر بووە و وە کوفر و شیرککردن یەکجار زۆر بووە وە فیرقەو تاقم و کۆمەڵەکانی پێچەوانەی ئەهلی سوننە و جەماعە زۆر بەربڵاون ، جا لێرەدا انسانی موسڵمان و موەحید دەکەوێتە قەلەقی و شوبهەوە ئایا لەپشت کێ نوێژ بکا و لە پشتی کێ نوێژ نەکات جا ئایا عەلمانی بن یا ئەوانەی پاشگری ئیسلامیان بەخۆیانەوە وەکردووە یان هەر کۆمەڵەیەکی تر بن کە هیچیان جێگەی سیقە نین خاستەن لەو سەردەمەدا کە سۆفیەکان قەبر و شێخ و مامۆستاکانی خۆیان دەپەرستن و شوێنێک مووقەدەس دەکەن کەئەنەما کەعبە و بیت المقدسە یان بیدعەچیەکان کە پاش ئەوەی دەلیلی شەرعیان بۆدەهینیەوە هێشتانەکە پێداگری لەسەر دەکەن و خۆیان پێی ڕاستە ، جا هەدەف و ئامانجی ئێمە ئەوەیە انسانی موەحید و موسڵمان ئاگادار بکەینەوە لەو جۆرە امامانە کە بیدعەچینە و نوێژیان لەدوا ناکرێت.

١٤٤٥/٨/١٠

# نوێژ لەدوای کێ بکەین؟

ئەوەی پێش نوێژی دەکات لەو حاڵ و حاڵەتانە بەدەر نیە یان ئەوەیە موسڵمانە بە کۆدەنگی زانایان کە نوێژی لەدوا دەکرێ بەڵام دابەش دەبێ بۆ دوو حاڵەت

١ / پابەند پارێزکار و موەحیدە ، دەبێ لەپشت ئەو جۆرە کەسانە نوێژ بکرێ

٢ / یاخود گوناهکارە و لەفەرمان دەرچووە و گوناهی هەیە لەنێوان خۆی و خودادا بەڵام نەگەیشتۆتە پلەی بیدعە و داهێنراوەکان ، ئەمەشیان بە کۆدەنگی زانایان درووستە نوێژی لەدوا بکرێ

یاخود ئەوەی پێش نوێژی دەکا بیدعە کارە کە بیدعەش دابەش دەبێتە سەر دوو جۆر

أ / بدعة مفسقة : ئەو جۆرە بیدعەیەیە کە خاوەنەکەی لە ئیسلام دەرناکات پێی کافر نابێ بەڵام گوناهـ بار دەبێت و لە گوناهەکان گەورە تری کردیە ، چونکە بدعة داهێنراوە و پێچەوانەی سوونـــــــــەتی پێغەمبەرە ﷺ

بدعة مفسقة دوو جۆرە.

١ ـ یان ئەوەیە دەعوە و بانگەوازی بۆ بدعةکەی دەکات

٢ ـ یانیش ئەوەیە تەنها بۆخۆی بدعەکەی کار پێدەکات و دەعوە و بانگەوازی بۆ ناکات ، ئەوەی دەعوە و بانگەوازی بۆ ناکات و تەنها کاری پێدەکات بەیەک دەنگی زانایان نوێژ لە دوای درووستە هیچی تێدا نیە بەڵام ئەوەی دەعوە و بانگەوازی بۆ دەکات و خەڵکیش هاندەدا و ڕادەینی لەسەر بدعەکە پاش ڕوونکردنەوەی دەقە شەرعیەکان لەسەری ئەگەر

پێداگری کرد زانایان هەندێکیان دەڵێن نوێژی لەپشت دەکرێ بەڵام هەندێکیان پێیان وایە نوێژی لەدوا نەکرێ چاکترە ( ئەوە ئەولاتر و چاکترە کە نوێژی لەدوا نەکرێ )

ب/بدعة مكفرة : یان ئەوەی پێش نوێژی دەکات و کافرە و موسڵمان نیە و لە ئیسلام دەرچووە چونکە نوێژەکەی قبوڵ نیە لای خودای گەورە لەبەر ئەوەی گەورەترین مەرج کە موسڵمان بوونە لێی نەهاتیتە جێ ، جا هەندێ لە زانایان گووتویانە دەبێ لە نوێژەکانی جومعە و جەماعەت و جەژنیش نوێژی لەدوادا نەکەیت و تا پێت بکرێ بچیتە جێگایەکی تر ، بەڵام ئەگەر کەست دەستنەکەوت لە مزگەوتانی تر ئەوا ئەم ڕێگایانەت لە پێشە.

پاش ئەوەی نوێژت لەدوای کرد نوێژەکەت دووبارە بکەیەوە،یاخود کاتێ لەپشتی نوێژ دەکەی نیەتی نوێژی (مفارقة) و تاکایەتی دەهێنیت

نوێژی مفارقة: ئەو نوێژەیە کاتێ دەیکەی ئەگەر بۆت دەرکەوت (ئیمام)ەکە ئەو کەسەی پێشنوێژی دەکات کافرە و لەئیسلام دەرچووە جا لە دڵتدا نیەتی نوێژی موفارەقە دەهێنیت و لەگەڵ(مأموم)ەکانی دی {نوێژکەرەکانی} دی دەچیە ڕکوع و ڕاست دەبیەوە و دەچیە سجود و هەڵدەستیەوە و نوێژ وەک ئەوان دەکەی و کەسیش هەستت پێناکات تۆ اقتدا و لاسایی ئەوت نەکردۆتەوە لە نوێژەکەدا

یاخودیش دەتوانن تۆ و کۆمەڵە موسڵمان و موەحیدێکی تر بچن لەدوای نوێژ بکەن بەڵام اقتدا و لاسایی ئەو کەسە نەکەنەوە کە کافرە و هەڵگەڕاوەتەوە لە ئیسلام بەوەی یەکێکتان نیەتی پێش نوێژی بهێنێت و ئەوانی تر نیەتی مأموم بهێنن کەلە پشت و تەنیشتی دەوەستن لە نوێژەکانیان ، بەڵام ئەو موەحیدەی ئیمامەتی کۆمەڵە موەحیدەکەی تر دەکات وەکو خەڵکەکەی دیکە هەڵبستن و دانیشن ، (واتە : کۆمەڵە موەحیدێک یەکێک هەڵدەبژێرن بۆ ئیمامەتی و

دەچنە نوێژی کافرێک و هەڵگەڕاوەیەک لە ئیسلام جولەو دانیشتنیان وەک و خەڵکەکەی دیە تەنها ئەوەی جیاواز بێت ئەوەیە کۆمەڵە موەحیدەکە مأمومی بۆ ئیمامە کافرەکە ناکەن بەڵکو مأمومی بۆ موەحیدەکە دەکەن) کە ئەم جۆرەشیان ڕێگە پێدراوە و بە جەماعەت حیساب دەبێ لەلای هەندێ لە زانایان .

## پرسیارێک ؟

جا لێرەدا پرسیارێک دێتە پێشەوە ئایا نوێژ لەدوای کافرێک بکەم بەڵام دووبارەی بکەمەوە یان هەر لەدوای نەکەم ؟

و/ (واللە اعلم) زانایان دەڵێن نوێژی لەدوا نەکەی چاکترە بەڵام ئەگەر نوێژی جومعە یان جەژنەکانت لەدوای کرد دەبێ دووبارەی بکەیتەوە ئەگەر کەست دەست نەکەوت

(واتە. ئەگەر کەست دەست نەکەوت بیکە بەڵام دووبارەی بکەوە)

وەک امام احمد بن الحنبل لێی گێڕدراوەیە کە دەڵێ ئەگەر (ئەو کەسەی پێشنوێژی دەکات) مورتەدیش بێت نوێژی لەدوا دەکەم بەڵام دوای دووبارەی دەکەمەوە

وە یەحیای کوڕی مەعینیش چل ساڵ نوێژی هەینی دووبارە کردۆتەوە چونکە لەسەردەمی ئەودا جەهمییەکان زاڵ بوونە بەسەریان

∴ ئەگەر لە نوێژی جومعە بووی و ئیمامەکە کافر بوو و تۆش نوێژت لەدوای کرد لەوکاتەی کە نوێژەکەت دووبارە دەکەیەوە دوو ڕکاعەتی نوێژ جومعە ناکەی بەڵکو چوار ڕکاعەتی نوێژی نیوەڕۆ دەکەیتەوە (واللە اعلم).

## ئەو کەسانەی کە نازانرێ عەقیدەیان چۆنە؟

ئەوانەشی کە حاڵیان دیار نیە و نازانرێ ئایا موسڵمانن یاخود کافرن ڕای پەسند ئەوەیە دەتوانی بەبێ لێپێچینەوە نوێژی لەدوا بکەی ، بەڵام ئەو عیبادەتە و تەقوایە ئەگەر ویستت لێی ئەمین بی و چێژی لێوەرگری ئەوا دەتوانی لە حاڵ عەقیدەی إمامەکە بپێچیەوە بەتایبەتی ئەگەر لە دار الکفر (ئەو وڵاتەیە کە لەژێر دەستی کافرانە) بی یا لەو سەردەم و زەمانانەی کە گومڕایی و شیرک و کوفر و بدعة مکفرە زۆر بێت تا بزانی کە ئایا موسڵمانە یان نا ئەگەر لێتۆکڵیەوە زانیت کە موسڵمانە نوێژی لە دوا بکە بەڵام ئەگەر زانیت کافرە ئەوا ئەو ڕێگایانە بگرە بەر کە باسمان کرد (واللە اعلم).

## چەند قسەیەکی ابن تیمیة:

ابن تیمیە رحمە اللە دەفەرمووێ: (أَمَّا الصَّلَاةُ خَلْفَ الْمُبْتَدِعِ فَهَذِهِ الْمَسْأَلَةُ فِيهَا نِزَاعٌ وَتَفْصِيلٌ) نوێژ کردن لەدوای کەسێ کە بیدعەکار بێ دووروو دریژی و ناکۆکی تێدایە مەسەلەکە لەنێوان زانایان (فَإِذَا لَمْ تَجِدْ إمَامًا غَيْرَهُ كَالْجُمُعَةِ الَّتِي لَا تُقَامُ إلَّا بِمَكَانٍ وَاحِدٍ) ئەگەر هیچ پێشنوێژ و ئیمامێکت نەبینی و دەستتنەکەوت و نەتزانی هەیە بەتایبەتی ئەوانەی نوێژی جومعان دەکەن وە جگەلە ئەوێش لە شوێنی تر نەدەکرا ئیلا لەوێ دەکرا و تەنها ئەو ئیمامەش هەبوو (وَكَالْعِيدَيْنِ ) یان نوێژی هەروو جەژنەکان بوو (وَكَصَلَوَاتِ الْحَجِّ ) یان لە نویژەکانی حەجدا (خَلْفَ إمَامِ الْمَوْسِمِ) کەلەو مەوسیم و وەرز و کاتەدا پێشنویژی دەکرد ( فَهَذِهِ تُفْعَلُ خَلْفَ كُلِّ بَرٍّ وَفَاجِرٍ بِاتِّفَاقِ أَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ) ئەوا لەو کاتەدا لەدوای باش و خراپیەوە نوێژەکە بکرێ بە ئیتفاق

و كۆدەنگی ئەهلی سووننەو جەماعە { لێرەدا شێخ مەبەستی لەو بیدعانە نیە کە کەسەکەی لە  ئیسلام دەباتە دەرێ (بدعة مكفرة) مەبەستی لە بدعة مفسیقەیە والله اعلم }

(إِنَّمَا تَدَعُ مِثْلَ هَذِهِ الصَّلَوَاتِ خَلْفَ الْأَئِمَّةِ أَهْلِ الْبِدَعِ كَالرَّافِضَةِ وَنَحْوِهِمْ مِمَّنْ لَا يَرَى الْجُمُعَةَ وَالْجَمَاعَةَ إذَا لَمْ يَكُنْ فِي الْقَرْيَةِ إلَّا مَسْجِدٌ وَاحِدٌ فَصَلَاتُهُ فِي الْجَمَاعَةِ خَلْفَ الْفَاجِرِ خَيْرٌ مِنْ صَلَاتِهِ فِي بَيْتِهِ مُنْفَرِدًا؛ لِئَلَّا يُفْضِي إلَى تَرْكِ الْجَمَاعَةِ مُطْلَقًا) ئەوەی کە وتمان درووستە بەیەک دەنگی ئەهلی سووننەو جەماعە دەفەرمووێ تەنها نموونەی ئەو نوێژانە لەدوای ئەوانەی کە پێشنوێژن ئەهلی بیدعن وەک رافیضەکان نمونەی ئەوانیش ئەوانەن کە پێیان وانیە جومعە و جەماعەت دەکرێتن بەڵام اهل سووننە و جەماعە هەمان هەڵوێستی وانیان نیە پاشان دەفەرمووێ ئەگەر لە ئاوەدانی و لادێ و گوندێکی ئیلا یەک مزگەوتێکی لێبوو و نوێژی جەماعەتی تێدا دەکرا ئەو نوێژە لەدوای کەسێکی خراپ و گوناهباریش بیکەی چاکترە لەوەی لە ماڵێ بەتەنیا بیکەی [تا لە جومعە و جەماعەت سارد نەبیەوە] (وَأَمَّا إذَا أَمْكَنَهُ أَنْ يُصَلِّيَ خَلْفَ غَيْرِ الْمُبْتَدِعِ ) بەڵام ئەگەر توانات هەبوو لەدوای جگەلە بیدعەکارێک توێژ بکەی و پێش نوێژێکی باش هەبوو (فَهُوَ أَحْسَنُ وَأَفْضَلُ بِلَا رَيْبٍ) ئەوا چاکتر و باشترە بیکەی بەبێ شک و گومان (لَكِنْ إنْ صَلَّى خَلْفَهُ فَفِي صَلَاتِهِ نِزَاعٌ بَيْنَ الْعُلَمَاءِ.) بەڵام ئەگەر نوێژت کرد لەدوای ئەوا زانایان لەسەری ناکۆک ڕا جیاوازن (مَذْهَبُ الشَّافِعِيِّ وَأَبِي حَنِيفَةَ تَصِحُّ صَلَاتُهُ) لەلای مەذهەبی شافعی و ابو حنیفە نوێژەکەت درووستە (أَمَّا مَالِكٌ وَأَحْمَد فَفِي مَذْهَبِهِمَا النِّزَاعُ وَتَفْصِيلٌ[1] ) بەڵام لای مەزهەبی مالک و احمد بن الحنبل ڕا جیایی و ناکۆکی دوور و درێژی هەیە .

[1] مجموع الفتاوى - المجلد ٢٣ – الصفحة ٣٥٥

(وَهَذَا إِنَّمَا هُوَ فِي الْبِدْعَةِ الَّتِي يُعْلَمُ أَنَّهَا تُخَالِفُ الْكِتَابَ وَالسُّنَّةَ) لەو بیدعانەی کە بیدعەچی بێ پێش نوێژەکە پێچەوانەی قورئان سووننەت بێ

(مِثْلَ بِدَعِ الرَّافِضَةِ وَالْجَهْمِيَّةِ وَنَحْوِهِمْ) وەکو بیدعەی رافضە و جەهمیەکان و هاوشێوەکانیان (فَأَمَّا إذَا ظَهَرَتْ السُّنَّةُ وَعُلِمَتْ فَخَالَفَهَا وَاحِدٌ فَهَذَا هُوَ الَّذِي فِيهِ النِّزَاعُ [1]) بەڵام ئەگەر سوونەت دیار بوو وە زانرا پێچەوانەی سوونەت کراوە ئەوا پێی دەوترێ . ناکۆکی دووبەرەکیی و جیاوازی لەنێوان زانایان ، وە لە شوێنێکی تردا شێخ الاسلام دەفەرمووێ : (وَمِنْ أُصُولِ أَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ أَنَّهُمْ يُصَلُّونَ الْجُمَعَ وَالْأَعْيَادَ وَالْجَمَاعَاتِ لَا يَدَعُونَ الْجُمُعَةَ وَالْجَمَاعَةَ كَمَا فَعَلَ أَهْلُ الْبِدَعِ مِنْ الرَّافِضَةِ وَغَيْرِهِمْ) وە لە ئەسڵ و بنجینەکانی ئەهلی سوونەو جەماعەیە ئەوان نوێژەکانی جومعە و جەژنەکان و جەماعەت (نویژی بە کۆمەڵ ) وازلێناهێنن هەروەکو بیدعەکاران وازیان لێهێناوە وەک ڕافیضە و شیەعەکان و هاوشێوەی ئەوان (فَإِنْ كَانَ الْإِمَامُ مَسْتُورًا) وە ئەگەر پێشنوێژەکە حاڵ و عەقیدەی دیار نەبوو و نەدەزانرا ( لَمْ يَظْهَرْ مِنْهُ بِدْعَةٌ) وە هیچ بیدعەیەکی لێ نەبینرابوو (وَلَا فُجُورٌ) هیچ تاوان گوناهێکی لێ بەدیار نەکەوتبوو(صَلَّى خَلْفَهُ الْجُمُعَةَ وَالْجَمَاعَةَ بِاتِّفَاقِ الْأَئِمَّةِ الْأَرْبَعَةِ وَغَيْرِهِمْ مِنْ أَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ) ئەوا نوێژی جومعە و جەماعەتی بەدوادا دەکرێ بە کۆدەنگی ڕێکەوتنی هەر چوار سەر مەذهەبەکە و جگەلە وانیش لە پێشەوایانی موسڵمانان (وَلَمْ يَقُلْ أَحَدٌ مِنْ الْأَئِمَّةِ إنَّهُ لَا تَجُوزُ الصَّلَاةُ إلَّا خَلْفَ مَنْ عُلِمَ بَاطِنُ أَمْرِهِ ) وە کەسیش لە پێشەوایان نەیان فەرمووە نوێژ جائیز نیە لەپشتی ئیلا دەبێ شتە پەنهانەکان و نادیارەکانی دڵی بزانی(جا نوێژ لەدوای جائیزە) ( بَلْ مَا زَالَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ بَعْدِ نَبِيِّهِمْ يُصَلُّونَ خَلْفَ الْمُسْلِمِ الْمَسْتُورِ) بەڵکو موسڵمانان لەدوای پێغەمبەرﷺ بەبەردەوامی نوێژیان لەپشت ئەو موسڵمانانە کردووە کە حاڵ و باڵی دیار نیە و نازانرێ چۆنە

[1] مجموع الفتاوى – المجلد ٢٣ – الصفحة ٣٥٦

(وەک باسمان کرد لەسەرەوە ) ( وَلَكِنْ إذَا ظَهَرَ مِنْ الْمُصَلِّي بِدْعَةٌ أَوْ فُجُورٌ وَأَمْكَنَ الصَّلَاةُ خَلْفَ مَنْ يُعْلَمُ أَنَّهُ مُبْتَدِعٌ أَوْ فَاسِقٌ مَعَ إمْكَانِ الصَّلَاةِ خَلْفَ غَيْرِهِ فَأَكْثَرُ أَهْلِ الْعِلْمِ يُصَحِّحُونَ صَلَاةَ الْمَأْمُومِ وَهَذَا مَذْهَبُ الشَّافِعِيِّ وَأَبِي حَنِيفَةَ وَهُوَ أَحَدُ الْقَوْلَيْنِ فِي مَذْهَبِ مَالِكٍ وَأَحْمَدَ) وە ئەگەر هاتوو پێسنوێژێک بیدعە و تاوان و گوناهی لێ بەدیار کەوت و دەتوانرا نوێژ لەدوای ئەو و کەسانی تریش بکرێ کەلەو باشتر بن ئەوا ئەو نوێژەی لەدوای بیدعەچی و گوناهکارەکەی کراوە ئەوا نوێژەکەی ڕاستە و هیچی تێدا نیە لەمەذهەبی شافعی و ابو حنیفە و وە قسەیەکیش لە مەذهەبی مالک و احمد بن الحنبل (وَأَمَّا إذَا لَمْ يُمْكِنْ الصَّلَاةُ إلَّا خَلْفَ الْمُبْتَدِعِ أَوْ الْفَاجِرِ كَالْجُمُعَةِ الَّتِي إمَامُهَا مُبْتَدِعٌ أَوْ فَاجِرٌ وَلَيْسَ هُنَاكَ جُمُعَةٌ أُخْرَى فَهَذِهِ تُصَلَّى خَلْفَ الْمُبْتَدِعِ وَالْفَاجِرِ عِنْدَ عَامَّةِ أَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ) وە ئەگەر هیچ پێشنوێژێک بەدەست نەدەکەوت لە جومعەدا ئیلا بیدعەچی و گوناهـ کارەکە نەبێ یان وتارخوێنێک بوو کە گوناهـ کار بوو وە لەهیچ شوێنێکی تر جومعە نەدەکرا ئەوا نوێژەکەی درووستە لەلایەن گشتی و زۆرینەی ئەهلی سوونە و جەماعە (وَهَذَا مَذْهَبُ الشَّافِعِيِّ وَأَبِي حَنِيفَةَ وَأَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ وَغَيْرِهِمْ) وەک مەذهەب و ڕێڕەوی شافعی و ابو حنیفە و احمد بن حنبل و جگەلەوانی تریش ( مِنْ أَئِمَّةِ أَهْلِ السُّنَّةِ بِلَا خِلَافٍ عِنْدَهُمْ) بەبێ ڕاجیاوازی تێکڕای زانایانی تری ئەهلی سوونە و جەماعە (وَكَانَ بَعْضُ النَّاسِ إذَا كَثُرَتْ الْأَهْوَاءُ يُحِبُّ أَنْ لَا يُصَلِّيَ إلَّا خَلْفَ مَنْ يَعْرِفُهُ عَلَى سَبِيلِ الِاسْتِحْبَابِ) جا ئەگەر (لەکاتی بیدعە و گومڕایی زۆردا )کەسێک وای پێخۆش و باش بوو کە حەزی لێبێ تەنها لەپشت کەسێکی نوێژ بکات کە دەیناسێ و حاڵ و باڵی دەزانێ ئەوا چاکترە بۆی وەک و خێر خێری دەگاتێ(كَمَا نُقِلَ ذَلِكَ عَنْ أَحْمَدَ أَنَّهُ ذَكَرَ ذَلِكَ لِمَنْ سَأَلَهُ. وَلَمْ يَقُلْ أَحْمَدُ إنَّهُ لَا تَصِحُّ إلَّا خَلْفَ مَنْ أَعْرِفُ حَالَهُ[1] ) هەروەک جۆن احمد بن الحنبل بۆی

---

١ مجموع الفتاوى – المجلد ٣ – الصفحة ٢٨٠

باسکراوە کە کەسێکی وا هەبووە لەسەردەمی ئەودا بۆیە پرسیاری سەبارەت لێکرا و وە احمد بن الحنبل نەیفەرمووە نوێژ لەدوای ئەو کەسە درووست نیە کە حاڵ و باڵی نازانرێت . وە دەفەرموویێت : (فَالصَّلَاةُ خَلْفَ الْمَسْتُورِ جَائِزَةٌ بِاتِّفَاقِ عُلَمَاءِ الْمُسْلِمِينَ) وە نوێژ لەدوای کەسێکەوە کە حاڵ وباڵی دیار نیە ڕێگە پێدراوە لەلای زانایانی موسڵمان (وَقَدْ كَانَ الصَّحَابَةُ رِضْوَانُ اللَّهِ عَلَيْهِمْ يُصَلُّونَ خَلْفَ مَنْ يَعْرِفُونَ فُجُورَ) وە هاوەڵانیش ڕەزای خوایان لێبێ نوێژیان لەپشت کەسێ دەکرد کە دەیان زانی گوناهکارە (كَمَا صَلَّى عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ) هەر وەک عبداللهی کوڕی مسعود ئەو جۆرە نوێژەی کردووە. (وَغَيْرُهُ مِنْ الصَّحَابَةِ) وە هاوەڵانی تریش لەم جۆرە نوێژەیان کردووە ( خَلْفَ الْوَلِيدِ بْنِ عُقْبَةَ بْنِ أَبِي معيط ) لەپشت الْوَلِيدِ بْنِ عُقْبَةَ بْنِ أَبِي معيط(وَكَانَ قَدْ يَشْرَبُ الْخَمْرَ) وە مەشرووب خۆریش بووە (وَصَلَّى مَرَّةً الصُّبْحَ أَرْبَعًا وَجَلَدَهُ عُثْمَانُ بْنُ عفان عَلَى ذَلِكَ) جارێک چوار رکاعەتی نوێژی بەیانی بۆ کردین وە عوثمانی کوڕی عەفان جەلدی لێدا لەسەر ئەو کارەی(وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ وَغَيْرُهُ مِنْ الصَّحَابَةِ يُصَلُّونَ خَلْفَ الْحَجَّاجِ بْنِ يُوسُفَ) وە عبداللهی کوڕی عومەر و هاوەڵانی تریش نوێژیان لەپشت حەجاجی کوڕی یووسف کردووە ( وَكَانَ الصَّحَابَةُ وَالتَا بعون يُصَلُّونَ خَلْفَ ابْنِ أَبِي عُبَيْدٍ وَكَانَ مُتَّهَمًا بِالْإِلْحَادِ وَدَاعِيًا إلَى الضَّلَالِ [١]) وە هاوەڵان و ئەوانەی شوێن هاوەڵانیش کەووتونە نوێژیان لەپشت باوکی عوبەید کردووە کە ئەو قسەیەی لەسەر بوو تۆمەتبار بووە بە ئیلحاد و لادان لە هەندێ لە بیرو بڕوا وە وە خەڵکیشی بانگ کردووە بۆ گوومڕایی.

(مَعَ أَنَّ أَحْمَد لَمْ يُكَفِّرْ أَعْيَانَ الْجَهْمِيَّة) لەگەڵ ئەوەشدا پێشەوا احمد بە دیارکردن و یەک یەک جەهمیەکانی بە کافر دانەناوە ( وَلَا كُلَّ مَنْ قَالَ إنَّهُ جهمي كَفَّرَهُ) وە هیچ جارێک نەیگوتوە

---

[١] مجموع الفتاوى – المجلد 3 – الصفحة 281

ئەوەی جەهمی بێت کافرە (وَلَا كُلَّ مَنْ وَافَقَ الْجَهْمِيَّةَ فِي[1] بَعْضِ بِدَعِهِمْ) وە ئەوانەشی هاوڕا بوونە لەگەڵ جەهمیەکان لە بیدعەکانیان( بَلْ صَلَّى خَلْفَ الْجَهْمِيَّةِ الَّذِينَ دَعَوْا إلَى قَوْلِهِمْ وَامْتَحَنُوا النَّاسَ وَعَاقَبُوا مَنْ لَمْ يُوَافِقْهُمْ بِالْعُقُوبَاتِ الْغَلِيظَةِ) بەڵکو نوێژی لە پشت جەهمیەکان دەکرد کاتێ خەڵکیان بۆ بیر و باوەڕی خۆیان بانگکردووە (کە دەیانوت قورئان مەخلوقە والعیاذ باللە) تا هاوڕا بن لەگەڵیان ئەگەر لەدژیان وەستابانایەوە ئەوە تۆڵەیان لێ دەکردنەوە بەسزایەکی سەخت توند (لَمْ يُكَفِّرْهُمْ أَحْمَد وَأَمْثَالُهُ) وە امامی احمدو هاوشێوەی امام احمد ئەوانیان بە کافر دانەناوە(بَلْ كَانَ يَعْتَقِدُ إيمَانَهُمْ وَإِمَامَتَهُمْ؛ وَيَدْعُو لَهُمْ؛ وَيَرَى الِائْتِمَامَ بِهِمْ فِي الصَّلَوَاتِ خَلْفَهُمْ وَالْحَجَّ وَالْغَزْوَ مَعَهُمْ وَالْمَنْعَ مِنْ الْخُرُوجِ عَلَيْهِمْ مَا يَرَاهُ لِأَمْثَالِهِمْ مِنْ الْأَئِمَّةِ. وَيُنْكِرُ مَا أَحْدَثُوا مِنْ الْقَوْلِ الْبَاطِلِ الَّذِي هُوَ كُفْرٌ عَظِيمٌ وَإِنْ لَمْ يَعْلَمُوا هُمْ أَنَّهُ كُفْرٌ؛ وَكَانَ يُنْكِرُهُ وَيُجَاهِدُهُمْ عَلَى رَدِّهِ بِحَسَبِ الْإِمْكَانِ؛ فَيَجْمَعُ بَيْنَ طَاعَةِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ فِي إظْهَارِ السُّنَّةِ وَالدِّينِ وَإِنْكَارِ بِدَعِ الْجَهْمِيَّةِ الْمُلْحِدِينَ؛ وَبَيْنَ رِعَايَةِ حُقُوقِ الْمُؤْمِنِينَ مِنْ الْأَئِمَّةِ وَالْأُمَّةِ؛ وَإِنْ كَانُوا جُهَّالًا مُبْتَدِعِينَ؛ وَظَلَمَةً فَاسِقِينَ[2]) پێشەوا احمد بن الحنبل نوێژەکانی بەدوای ئەو ئیمامانە دەکرد وە شوێنیان دەکەوت لە کاتی نوێژی جەماعەت نوێژی حەج و جومعە وە پێشی درووست بوو جیهادیان لەگەڵ بکا وە خەڵکی قەدەغە دەکرد لەوەی کە نمونەی ئەوانیش بوو بەسەریانەوە کە بە شەڕ و کوشتار بیان هێننە خوارەوە لەسەر دەسەڵات وە امام احمد لەگەڵیان نەبوو لە قسە کوفری و بیدعە پڕووپووچەکانیان و ئینکاری لێ دەکرد و کۆششی دەکرد تا بەپێی توانا وەڵامیان بداتەوە کەواتە لەنێوان گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خودا و پێغەمەرﷺ لەپیشاندانی ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ دین وئاین وە ئینکار کردن و بەرهەڵەستی کردنی بیدعەی جەهمیە لەڕێلادراوەکان بە ڕیعایەت کردنی مافی

[1] مجموع الفتاوى – المجلد 7 – الصفحة 507
[2] مجموع الفتاوى – المجلد 7 – الصفحة 508

بڕواداران لەپێشەوایان وئوومەت ئەگەر بێت و نەزان بووبن یا بیدعەیان کردبێ یا ستەم کار بووبن یا فاسق و لەفەرمان دەرچووش بووبن ئەوانەی کە سەرکردە بووبن لەو سەردەمی و پێشەوا بووبن

# کۆتایی

لە کۆتایی قسەکان ، ئەگەر بۆمان ڕون بوویەوە  ئەوەی پێشنوێژی دەکا بیدعەی هەبێ بەڵام لە ئیسلام دەری نەکات (بدعة مفسقة)بێ ئەوا نوێژی لەدواوە درووست و جائیزە بەڵام دەبێ بۆی ڕوونبکەیەوە و تێی بگەیەنی و ئەگەر امامی چاکتر هەبوو باشرە بچیە ئەوێ تا بە بیانووی ئەوەی واز لە جومعە و جەماعەت نەینی وەک چۆن پێشەوا احمد فەرموویەتی ئەگەر ئەوەی پێشنوێژی دەکا مورتەد بێ نوێژی لەدوا دەکەم بەڵام دوای دووبارەی دەکەمەوە وە لەسەردەمی خۆشمان ئەوانەی عەلمانینە و پاشگری ئیسلامیان پەخۆیانەوە وەکردووە باوەڕیان بە دیموکراسی و هەڵبژاردن هەبێ و پشتگیری کافران بکەن لەدژی موسڵمانان چ بە قسە بێ چ بە کردار ئەوا نوێژ لەدوایان جائیز نیە ئەگەر کردیشت بەنیەتی نوێژی موفارەقە یان نوێژەکەت دووبارە بکەیەوە خۆ ئەگەر کەسێکی چاک هەبوو بڕۆ نوێژ لەوێ بکە نەوەک نوێژەکان نەکەی وەک ڕافیضەکانت لێبێت وەک ابن تیمیە فەرمووی

هیوادارم توانیبێم ڕاستی و ڕێکیەکان لەو بابەتەدا بگەیەنم بە موسڵمانان  ، ئەوەی گوێی لێ ڕابگرێ سوود دەبینێ و دەزانی چۆن بۆمان ڕوونکردۆتەوە والله اعلم بالصواب.

وصل الله وسلم على نبينا محمد وعلى اله وصحبه اجمعين